أنه أمام نبي مرسل وعبقري عظيم لم تلد مثله البطون حتى اليوم[٦٥]..

## عبد الله لويليام

رۆشنای "مەدینە" و "شاری مەدینە" لەدوای موحەممەد بەماوەیەکی کەم لە نوچکەکانی زەوی بلاو بۆتەوە لە رۆژهەلات تا رۆژئاوا ... هۆکاری ئەمە چی بوو؟ تەنها ئەوەنەبێت کە **فەرمان و قەدەغەکراوەکانی** یەکانگیر بوو لەگەڵ ئەقڵ و کت و مت **لەگەڵ دانایی دا هاتووە** .

امتدت أنوار المدنية بعد محمد ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ في قليل من الزمان ساطعة في أقطار الأرض من المشرق إلى المغرب حتى إن وصول أتباعه في ذلك الزمن اليسير إلى تلك المرتبة العلية من المدنية قد حيّر عقول أولي الألباب. وما السبب في ذلك إلا كون أوامره ونواهيه موافقة لموجب العقل ومطابقة لمقتضى الحكمة"[٦٦].

## كولد تسيهر[٦٧] Y. Gldziher

... بێگومان موحوممەد یەکەم چاکەکاربووە لە نێو گەلی عارەبی ...

".. الحق، أن محمدا ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ كان بلا شك أول مصلح حقيقي في الشعب العربي من الوجهة التاريخية"[٦٨].

---

[65] - البحث عن الله، لاپەڕە، ٥٢ .

[66] - "احسن الأجوبة عن سؤال احد علماء أوروبا" ، لاپەڕە ٢٢

[67] - كولد تسيهر (١٨٥٠-١٩٢١م) Y. Gldziher

دەرچووی زانکۆکانی: "بودابیست" ، "برلین" ، "لیدن" د لە بواری زمانەی سامی یەکان، بە وانەبێژ دامەزرا لە کۆلیژی زانست لە زانکۆی بۆدابیست ١٨٧٢، زۆر لە ولاتە عارەبیەکان گەڕاوە، لە چەندین کۆڕی کۆمەڵە زانستی عارەبی ئەندام بووە ، لەدانراوەکانی : " العقيدة والشريعة في الإسلام" ١٩٢٠ ، " درس في الإسلام" کە دوو بەرگە ، وەك چۆن لە زۆر تێکستی کۆنی کۆڵیوەتەوە .

[68] - العقيدة والشريعة في الإسلام ، لاپەڕە ١٣ .

## روم لاندو

.... لـە نهێنـی و ئاشـکرایی دا پیـاوێکی کارکـەر بـووە ... کـاری گرنگـی موحەممەد بریتی بوو لە لەناوبردنی ڕژێمی بەهێزی خێڵایـەتی ... کـە ئـەم ڕژێمـە هۆکاربوو بۆ هەرگیرسانی جەنگ .

... كان في سرّه وجهره رجلاً عمليًا[٦٩]..

"كانت مهمة محمد ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ هي القضاء على النظام القبلي القـوي الذي كان مسؤولاً عن اندلاع نار الحرب... "[٧٠].

## ماسیە[٧١] H. Masse

"موحەممەد" یەکـەم بزوێنـەر بـووە لـەنێوان هـەموو گـەلان کـە ئـاینێکی بـۆ هەموو نەتەوەکان هێنابێت .... "ﷺ" سادە بووە[٧٢].

".. كان محمد ﴿صلى الله عليه وسلم﴾ هو المشرّع الملهم والمحرك الأول للوحدة الدينيـة بين جميع الأقوام، .. وكان بسيطًا وحازمًا.."[٧٣].

---

[69] - الإسلام والعرب، لاپەڕە ٣٣ .

[70] - هەمان سەرچاوە ، لاپەڕە ٣٤ .

[71] - هنري ماسيه H. Masse

لە ساڵی 1886 لەدایك بووە، وەك بەڕێوەبەری پەیمانگای فەرەنسی لە قاهیرە کاری کردووە، مامۆستابووە لە زانکۆی "الجزائر" (١٩١٦ ١٩٢٧) لە هەریەك لە " مجمع الكتابات والآداب" و " المجمع العلمي العربي بدمشق" ئەندام بووە ، حوکمەت زۆر کاری گرنگی پێ ڕاسپاردووە، و زێکخراوی یونسکۆ وەك ئەندام لە لیژنەی ڕۆژهەڵات ناسەکان هەڵی بژاردووە .

لەدانراوەکانی: کتێبێك لەسەر شاعیر "سعدی" ١٩١٩ هەروەها "الاسلام" ١٩٥٧ و ...

[72] - سەرچاوەی ووتەی زاناکان دوو بەشن هێندێکیان لە ماڵپەری islamonline.net و بەشێکیان لە "منتدی" ی ماڵپەری بانگخواز عەمر خالد forislam.com ئامادەکراوە. هێندێکیانم لە گەڵ سەرچاوە بنچینەکان بەراور کردووە بەلام کات دەرفەتی لێ ساندووم تا بەهەموو سەرچاوەکان دا بچمەوە، کرمانج – هەولێری .

[73] - الإسلام ، لاپەڕە ٥٩ .

## دەڵێم :

**ئەگەر دەتەوێت**

**سلاو کردنت , رۆیشتنت بەرێگاوە ,**

**گەشت و گوزارت , خەندە و گریانت , پارانەوە وپەرستشت ,تورەبون و ئاشت بونەوەت , , رابواردن و حەسانەوەت ، دواندنی دایە و بابەت یان هاوڕیکانت, خۆشەویستیت: بۆ خاکەکەت یان پارەکەت ...**

**هەموو ئەمانە جۆرە تام و چێژێکی خۆشترت پێبدات ئەوا ﷺ بناسە...**

**ئەوکات ژیانت تام و بۆن و رەنگێکی تر وەردەگرێت .. کە وێنا ناکرێت مەگەر بۆخۆت نەیچێژی ...هەوڵبدە.. ..بیدۆزەوە ..ﷺ یێک کە هەموو شتەکانت بۆ نویێ دەکاتەوە ..کالای رۆحیی لایە لای کەسی تر نیە..**

**بیدۆزەوە .**

## ❖ هەوڵەکانی کەنیسەی رۆژئاوا و داردەستەکانیان لە رۆژهەڵات بۆ بە گاورکردنی مسوڵمانان

## ❖ مسوڵمانبوونی گەورە قەشەی ئەفریقی "ئاشوك کۆڵن یانق"

ئاشکرا بوونی چەند نهێنیەك لە دوو چاوپێکەوتنی " ئاشۆك" بخوێنەوە

## ئاشوك كولن يانق لە چەند دێڕێكدا



❖ لە شاری "يرول" ی ناوچەی بحيرات لە خوارووی سۆدان لە دايك بووە و خوێندنی سەرەتايی لە هەر لەوێدا تەواو كردووە .

❖ خوێندنی ناوەندی و دواناوەندی لە "ئوغەندە" تەواو كردووە .

❖ زانياری لاهوتی[٧٤] لە ويلايەتی تەكساسی وولاتە يەكگرتووەكانی ئەمريكا تەواو كردووە .

❖ باوكی بەرپرسی كەنيسە بووە لە رۆژهەلأت و ناوەڕاستی ئەفريقا كە بنكەكەی لە "ئوغەندە" بووە .

❖ چەندەها شەهادەی دبلۆمی وەرگرتووە لە بوارەكانی خوێندن و نەخشەكێشانی كەنيسەيی و بە گاوركردن و گەشەسەندنی كۆمەڵ لە نەرويج و كينياو خەرتووم .

❖ ماجستێری بە دەست هێناوە لە زانياری لاهوتا لە زانكۆی "ئۆكسفۆرد" لە بەريتانيا .

❖ بۆتە خاوەن زۆرێك لە پلەو پايە كەنيسەی يەكان لەوانە :

- بەڕێوەبەری ڕێكخراوی نەرويجی بۆ يارمەتيدانی كەنيسەيی، بەڕێوەبەری ڕێكخراوی نەرويجی بۆ يارمەتی و گەشەی مندالأن.
- بەڕێوەبەری ڕێكخراوی لادان و نەهێشتنی ڕودەوەكان بووە لە سۆدان،

[74] - لاهوت/ علم يبحث عن العقائد المتعلقة بالله/ ئاين گەری. كرمانج هەولێری

که ڕێکخراوێکی هاوبەشی سویدی و دانمارکی و هۆڵەندیە

- قەشە بووە لە کەنیسەی ئەسقەف لە خەرتوم .
- بەڕێوەبەری بەرنامەی گەشەسەندن بووە لە سۆماڵ کە سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکانە .
- ئەمینداری گشتی کۆڕی کەنیسەی جیهانی بووە بۆ ڕۆژهەلآت و ناوەڕاستی ئەفریقا (١٩٩٢-١٩٩٣م ) .
- لێپرسراوی خوێندنی باڵای کەنیسە بووە لە ناوەڕاست و ڕۆژهەلآتی ئەفریقا .
- بەڕێوەبەری کۆلیجی "نیل" بووە بۆ دیراساتی لاهوتی لە سۆدان .
- ئەمینداری گشتی ڕێکخراوی لاوانی مەیسحی بووە ( ١٩٨٧ ١٩٨٨م ) .
- ئەمینداری گشتی ڕێکخراوی یەکگرتنی مەسیحی بووە لە ئەفریقا .

❖ لە ساڵی ٢٠٠٢م بووە بە مسوڵمان.

❖ ئێستا ئەمینداری گشتی ڕێکخراوی یەکگرتنی ئیسلامی یە بۆ گەشەسەندن وئاوەدانکردنەوەی سۆدان ٢٠٠٣م .

# کاردیناڵی پێشوو (ئاشوك كولن یانق) چەند لایەنێك لەگەشتەكەی بەرەو ئیسلام دەخاتەروو[75]

دیمانە: رەجەب ئەلـ - دەمەنهوری

وەرگێران :كرمانج _ هەولێری

گۆڤاری: ئەلـ - موجتەمەع

ژمارە:1644

ئەو چاوپێكەوتنەی كە گۆڤاری (ئەلـ ـ موجتەمەع)ی كوێتی لەگەڵ ئەمینداری پێشووی "ئەنجومەنی كەنیسەكانی جیهانی لە ناوەراست ر رۆژهەلاتی ئەفریقیا" دا سازیدا, كاردانەوەیەكی فراوانی نێو دەیان ماڵپەرو دەزگاكانی تری راگەیاندنی لێكەوتەوە....

"كۆلن یانق" كە سالی ٢٠٠٢ مسولمان بووە , لە چاوپێكەوتنێكی لەگەڵ گۆڤاری (المجتمع)دا نهێنی پلانی كەنیسە بۆ بەگاوركردنی مسولمانان و لێدانی بزاوتە ئیسلامیەكان ئاشكراكرد. ئەمیش لەرێگای خستنەكاری عەلمانیەكان لەبەرەنگاربوونەوەی رابوونی ئیسلامی و خەرج كردنی مال و دارایەكی زۆر بۆ هەندێك دەزگا و كەسی پەیوەندیدار بە بەگاوركردن..لەم ژمارەیەشدا كاردینالدی پێشوو هەندێك لایەن لەگەشتەكەی، خۆی گوتەنی ( لەتاریكیەكان بۆ رووناكی و لە كوفر بۆ ئیسلام و لە گوزەرانی خەلكی ئاگر بۆ گوزەرانەی خەڵكی روو لە

[75] - ئەم چاوپێكەوتنە ئەگەرچی دوای ئەوەی تر لەگەڵ بەرێز اشوك سازدراوە بەلام پرسیارەكانی زۆرتر تایبەتین بەكەسایەتی ئەم بەرێزە بۆیە بەندە خستویەتیە پێشتر. كرمانج هەولێری.

قیبلە) باس دەكات[76] .

**پرسیار :گۆڕینی بیروباوەڕ كارێكی ئاسان نیە، بەتایبەت ئەگەر ئەم مرۆڤە لەبەرزترین خاڵی سێكۆشەی ئەو بیرو باوەڕەبێت كەبانگەوازی بۆ دەكات...هۆكار چی بوو بۆگۆڕینی بیروباوەرت؟ ، لەپاشان، مسوڵمان بوونت بەهۆی لێكۆڵینەوەت بوو لە ئینجیلەكان؟**

پرسیارێكی گرنگە.. مرۆڤ هەرچەندەی پلەوپایەی بەرزبێت ئەگەر بەراستگۆیی و دڵكاریەوە بەدوای راستیدا بگەرێت بێگومان رۆژێك پێی دەگات، ئەم راستیەش كەپێی دەگات یان ئەوەتا بیروباوەرەكەی بەهێزتر دەكات ، یانیش رێكایەكی تری نیشان دەدات ... ئەمەلەلایەك ، بەلآم چۆن من بیروباوەرم گۆرا ؟ ئەمەیان بە خودی وتەكانی مەسیح (سەلامی خودای لێبیت) كە لەئینجیلەكاندا هاتووە وەلآمت دەدەمەوە.

لە ئینجیلی "یوحنا" ،ئیسحاحی ٨، برگەی ٤٠ هاتووە كاتێك جوولەكەكان ویستیان بیكوژن : " ولكنكم الآن تطلبون أن تقتلوني وأنا إنسان قد كلمكم بالحق الذي سمعه من الله"

واتا: بەلآم ئیستا ئێوە خوازیاری كوشتنی منن، منیش مرۆڤێكم بەو راستیەی كە كەلەخوداوە گوێم لێبووە ئێوەم دواندووە. كەواتە مەسیح (سەلامی خودای لێبیت) مرۆڤێك بووە خودا هەڵیبژاردووە و پەیامێكی خستۆتە سەرشانی و كردویەتیە پەیامبەر.

هەندێك لە ئینجیلەكان پەیامبەریەتی مەسیحیان(سەلامی خودای لێبیت) راگەیاندووە ، وەك چۆن لە "لۆقا" ،ئیسحاحی ٧، برگەی ١٦ داهاتووە:" فأخذ

[76] - ماڵپەری گۆڤاری المجتمع: almujtamaa-mag.com .

الجميع خوف ومجدوا الله قائلين: قد قام فينا نبي عظيم"

واتا : هەموویان ترس دایگرتن و بەدەم خودا بەبەرز راگرتنەوە دەیان گوت: پەیامبەرێکی گەورەمان تێدا دەرکەوت" .

لە ئینجیلی "مەتی" ،ئیسحاحی ٢١،برگەی (١١،١٠،٩) داهاتووە :"وَلَمّا دخل أورشليم ارتجت المدينة كلها قائلة: من هذا؟ فقالت الجموع : هذا النبي الذي من ناصرة الجليل"

واتا:کاتێك چووە ئۆرشەلیم شارەکە هەمووی هەژاو گوتی:ئەمە کێیە؟ کۆمەلەکە گوتیان: ئەمە پەیامبەرە ...

ئەم دەقانەش لەگەڵ ووتەی خودا کە لە قورئاندا هاتووە یەکانگیرە:

مَّا ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ ﴿٧٥﴾ [77]

واتا: مەسیحی کوری مەریەم هیچ شتێك نیە (نەخوایە و نەکوڕی خوایە)مەگەر پەیامبەرێکی خوانەبێت ، بەراستی پێش ئەو چەندەها پێغەمبەری تریش رابوردوون.

**پرسیار: کەواتە تۆ وادەبینی ئەم دەقانەی لە ئینجیلەکان وەرتگرتوون دەستەبەرن بۆ گۆڕینی بیرۆ باوەڕ لە نەسرانیەتەوە بۆ بیرو باوەڕی ئیسلامی ؟**

بڕوا هێنان بە پەیامەکەی عیسا (سەلامی خودای لێبیت) بە بەراستگۆدانای لەو هەواڵانەی کەپێی داوین و بەدرۆنەخستنەوەی و پێچەوانەنەکردنی دەبێت. مەسیح (سەلامی خودای لیبیت) لەلایەن خوداوە لەبەر دوو کاری گرنگ بۆ ئێمە هاتووە:

---

[77] - المائدة:٧٥.

***یەکەمیان:*** ئەو نەتەوەی کەبۆی نێردراوە فێریان بکات چۆن لە خودا نزیك دەبنەوە و دەی پەرستن، هەرچی ناسینی خوداشە مەسیح (سەلامی خودای لێبیت) دەلێت:"ان الله واحد لاشريك له ولانظيرله ولاشبيه له"

واتا: خودا تاقە وهاوبەش و هاوشان و هاوشێوەی نیە.

لە ئینجیلی "متى" ،ئیسحاحی ٢٣ ،برگە ٨ مەسیح (سەلامی خودای لێبیت) دەلێت:" وأمّا انتم فلا تدعوا لكم ابا على الارض لان اباكم واحد الذى فى السماء"

واتا: هەرچی بۆ ئێوەشە بانگی باوکێك لەسەر زەوی ناکەم چونکە باوکتان تاقە کە لەئاسماندایە.

هەروەها لە "يوحنا" ،ئیسحاحی ٢٠،برگە١٨ مەسیح گوتویەتی: " انى اصعد الى ابى و ابيكم و الهى والهكم"

واتا: من بەرزدەبمەوە( سەردەکەوم) بۆلای باوکم و باوکتان و خودام و خوداکەتان. وشەی"ابى وابيكم" بەپێی زمانی ئینجیل واتای (ربى و ربكم) پەروەردگارم و پەروەردگارتان دەگەیەنێت.

جا بە خۆشەویستانی مەسیح دەلێم: ئایا ئامۆژگاریەکانی مەیسح (سەلامی خودای لێبیت) پێناسەیەکی روون بۆ زاتی خودای بەرز و گەورەو تاقانە ناگرێتەوە ؟ خودای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێت:

قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ۝٢ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ۝٣ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ ۝٤ [78]

واتا: بلّێ ئەو خوایەی کەناوی الله خوایەکی تاك و تەنیایە. خوا زاتێکی پایەدارو دەسەلاتدارە. هیچ کەسی نەبووە و خۆیشی لە کەس نەبووە. هەرگیز

[78] العلق :١-٤

هاوتاو هاوشێوە و دەسەلاتدارێکی ترنیە کە لەبەرامبەری بوەستێت و هاوتای بێت.

وەك لە قورئاندا هاتووە:

وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ ﴿٢٥﴾ [٧٩]

واتا: ئێمە پێش تۆ هیچ پەیامبەرێکمان رەوانە نەکردووە، کە سروشتمان بۆ نەناردبێت بەوەی کە بێگومان هیچ خوایەك نیە جگە لەمن و دەبێت هەر من بپەرستن.

***دووەم:*** مەبەستی مەسیح (علیە السلام) ئەوەبووە نەتەوەکەی خۆی، کە بۆئەوان نێردراوە بۆ پەرستنی خودا رێنمایی بکات ، ئەویش نەتەوەی بەنی ئیسرائیلە(امە بنی اسرائیل) ،هەرچی نەتەوەی ترە جگە لە بەنی ئیسرائیل ئەوا شەریعەتی عیسا نایانگرێتەوە، ئەمەش لە ئینجیلەکاندا هاتووە، لە ئینجیلی "متی" ئیسحاحی ١٥، برگە٥ دا ووتەی یەسوع هاتووە:" ما ارسلت الا لخراف بنی اسرائیل الضالة"

واتا: من نەنێردراوم تەنها بۆ خەلەفاوەکانی بەنی ئیسرایلی گومرابوو نەبێت.

بەخۆشەویستانی مەسیح دەلێم: ئەی ئەوانەی بەدوای راستی دادەگەرێن .. ئەی ئەوانەی بروایان بە خودای تاق و تەنیا هێناوە ئەم دیاریەت لە ناخی دلەوەپێشکەش بێت: بروا بە خودایەکی تاقانە بێنە ، بەوەش کە مەسیح پەیامبەری خودایە و وتەی خۆیەتی خستویەتیە مەریەم و رۆحی ئەوە ، بروابێنە بەوەی کە ﷺ بەندە و پەیامبەریەتی و کۆتای پەیامبەرانە، بە تەواوترین

---

[79] - الانبیاء:٢٥

شێوەش دوایکەوە، بڵێ (لا الله الا الله ) خودا دووجار پاداشتت دەداتەوە.

**پرسیار: باسی ئەو ساتەمان بۆ بکە  کە بڕیارتدا ببیـت بەمـسوڵمان؟ ئـەو ڕووداوانەش کە بەدوایدا هاتن؟**

کاتێك بڕیارم دا ببم بەمسوڵمان، چوم بۆ کەنیسە و داوای پشوم کرد تـاوەکو لەگەڵ خێزانەکەمدا بەسەری ببەم. داوایان کرد کە چاوەڕوان بم تـاوەکو کەنیـسە بڕی ٥٠—١٠٠ هەزار دۆلارم بۆ دەبڕێتـەوە تـا لـە پـشووەکەمدا لەگـەڵ خێزانەکـەم خەرجی بکەین. گوتم :

ـ من (قرش[٨٠])ەکانتانم ناوێت . ئەوکاتەش دوو ساختمان و ٤٠٠ هەزار دۆلاری ئـەمریکی و ٣٢٠ ملیـۆن جنیـەی سـودانیم لابـوو ، هـەموویانم داوە بـە چـاودێری بۆدجەی بەگاورکردن ،ئەمە شتێکی چاوەڕوان نەکراوبوو بۆ کەنیسە.

لە پاشان لەگەڵ خێزانەکەم دوو ڕۆژ تاوتوێی مسوڵمان بونم کـرا .خێزانەکـەم کەپێکهاتبوو لە هاوسەرەکەم و چوار منداڵ دەیانزانی کە بـیر لـە مـسوڵمان بـوون دەکەمەوە ،کاتێکیش پێم گوتن کاتی ئەوەهاتووە، وەلامەکەیان ئەوە بوو کە :تۆ لەئیمە زاناتری و ئێمەش بڕوامان پێتە و بڕیاری تۆش بڕیاری هەموومانە، چـووین بۆ یەکێك لەمزگەوتە نزیکەکان "مزگەوتی نور" مسوڵمانبوونمان ڕاگەیاند.

ڕاستە من ماڵێکی زۆرم لەدەست چوو(بەمسوڵمانبوونم) بەڵام من بڕوا و ئارامی دەروونم دوای ٤٠ ساڵ لە بەسەربردنی نێو باتڵ بەدەست هێنا، هەر بۆیـەش دوای

[٨٠] قرش / (وحدة النقدية)، یەکەیەکە لە دراو وەك دینار و دۆلار ... کرمانج _ هەولێری

ئەمانە کەنیسە بە شێت بوون و نەخۆشی دەروونی تۆمەت باریانکردم [٨١].

**پرسیار: گوتت کەنیسە بە شێت تۆمەتباریان کردی..ئایا بۆیان روون بووەوە کە تۆ دوای قەناعەت و لێکۆڵینەوە لەپێگەیشتووترین باری عەقل مسوڵمان بوویت ، یان چی روویدا؟**

ویستی خودا وابوو کە من هەڵسەنگاندنێك لە نێوان ئاینەکاندا بکەم ، ئەو زانیاریانەشم لەسەر ئاینە ئاسمانیەکان و نائاسمانیەکان بۆ ئەوەبوو تاوەکو بتوانم کاری بەگاورکردن لەسەر بنچینەی زانین و پسپۆری و نەخشەوە بەجێ بێنم، بەڵام ویستی خودا شتێکی تربوو، من لە هەموو ئاینە ئاسمانیەکانم کۆڵیەوە، هەروەك چۆن لەئاینە نائاسمانیەکانیشم کۆڵیەوە ئەوانیش: بوذی وهیندۆسی وئاگرپەرست و شەیتانپەرست و سەنەم پەرستی، لە ماوەی لێکۆلینەوەمدا هەندێك راستیم لەبارەی ئیسلامەوە یەك بەدوای یەك بۆبەدەردەکەوت، خەریکبوو پێکهاتەی ئاینیم (بیروباوەری ئاینیم) دەگۆڕاو تێکدەپرژا، بۆیە لەقۆناغێکی لێکۆلینەومدا گەیشتمە ئەو راستیەی کە ئیسلام ئاینێکی دروستە.

کاتێك گوێم لە بانگی نوێژدەبوو وەك رێزگرتنێك لەبانگی خودایی لە گوتنەوەی وتار دەوەستام لەو کاتەوە بووم بەکەسێکی دووڕوو، روێك دەزانێت ئاینی ئیسلام راستەو خواش تاقە و هیچ هاوبەشێکی نیە، رووەکەی تر دەروونی خۆی بەهەڵەدادەبات و بەردەوام دەبێت لە خۆبەستنەوە بە کاروباری کەنیسەو

---

[81] - الله اکبر.. هەمان مێژوی ﷺ (درودی خودای لێبیت) دووبارە بۆتەوە ئەمیش ٤٠ سال تەمەنیەتی و بە راستگۆ و دستپاك و دانای هۆزەکەی ناسراوە بەڵام لەنێوان چەندساتێکی کەم (ساتەکانی دۆزینەوەی نوور) بووبە شێت و نەخۆش و ساحر .. خودای گەورە راستی فەرمووە: (أَتَوَاصَوْا بِهِ ۚ بَلْ هُمْ قَوْمٌ طَاغُونَ ﴿٥٣﴾).... کرمانج_هەولێری.

رابواردن بەو ماڵە زۆرەی کەنیسە کە لەبەر دەستیەتی.

کاتێك هەست و سۆزداریم لەگەڵ ئیسلام بەرەبەرە دەرکەوت ،ئەنجومەنەکانی کەنیسە و راهیبەکان و کاردینالّ کۆبونەوە و بڕوایان وابوو کە دڵم بەلای ئیسلامدا دەچێت، ئەلێرەوە ئەنجومەنی کەنیسەکان زۆر تەنگیان پـێ هەڵـچنیم ,کـاتێکیش کەسەرنەکەوتن بڕیاری وەستانی کـارکردنم لەکەنیـسەدرا، هـەموو کەنیـسەکانیش بڕیارێکیان دەرکرد بەوەی کە من شێت بوومە، پێم گوتن :

- من شێت نیم، من لەخودای تاقانە دەترسم پەروەردگاری من و پەروەردگاری ئێوە و پەروەردگاری ﷺ و عیسی، من لە سزای خودا دەترسم، من لەخودا دەترسم.

لەدوایی بەهۆی راپۆرتی پزیشکیەوە زانیم کە من شێت نەبوومە، بەڵکو خەریکم لە مسوڵمانبوونی خۆم دەڕوانم.

<u>**پرسیار: بەرێز ئاشوك.. بۆچی ناوی خـۆت بۆنـاوێکی ئیـسلامی نـەگۆڕیوە وەك چۆن باوە هەرکەسێك مسوڵمان بێت ناوی دەگۆڕێت؟**</u>

- لەبەر رەچاوکردنی دووخال ناوم نەگۆریوە:

***<u>یەکەم:</u>*** چـونکە ئیـسلام هـیچ لاریـەکی لەسـەرنیە،ئەمە بەپلـەی یەکـەم بـۆمن گرنگە، هـیچ لەوەدانیـە کـە یـەکێك ببێتـە مـسوڵمان و پارێزگـاریش لەسـەر نـاوە کۆنەکەی خۆی بکات ،ئاینی ئیسلام جەخت لەسەر بڕوا(الایمان)دەکاتەوە.

***<u>دووەم:</u>*** بۆ مەبەستی کاری بانگـەوازی حـەزم کـرد ناوەکـەم نـەگۆرم ،تـاوەکو نامسوڵمانەکان وەرم بگرن و لەپاشـان بتـوانم راسـتیان بـۆ روون بکەمـەوە، دوای ئەوەی کە خودا دڵی بە ئیسلام گوشادکردم لە تاریکیەکان بەرەو رونـاکی ، کـوفر بەرەو ئیسلام و گوزەرانی خەلکی ئاگر بۆ گوزەرانی خەلکی قیبلە.

<u>**پرسیار: لەکەنیسەدا گەیشتیت بە پلەی کاردینالّی وەک چۆن باوکیشتان بەم پلەیە گەیشتبوو ..مەبەست لەپلە کاردینالّی چیە؟ کارەکانی لەکەنیسەدا چین؟**</u>

لە کەنیسەدا چەند پایەکی گەورەم وەرگرت، لەنێوانیاندا کاردینالی بوو وەك چۆن باوکم کاردینال بوو ، لە کەنیسەی کاسۆلیکی دا کاری ئەم پایە وەك کاری موفتی لەئیسلام وایە، دەبێت قەشە ئەوەبزانێت کە خودایێك نیە تا لەگوناه و تاوانی خەلکی خۆشبێت، ***جێی سەرسوڕمانە*** کاتێ ـدەیێك تاوانێك دەکات رۆژی یەکشەم بەرلە نوێژکردن دەچێتە لای قەشە, پێی دەلّێت گوناهێکی واو وام کردوە، قەشەش پێی دەلێت: برۆ ئەوە لەتاوانەکەت بوورای، ئەم قەشەیە چۆن دەوێرێت دەسەلاتی خودا بۆخۆی هەلگرێت ، ئەوەی ئەو دەسەلاّتەی پێداوە مرۆڤە !

مـن لـەرووی هەریـەکێك لـە گـەورەترینی قەشـەکانی رۆژهـەلاتی و رۆژئـاوایی دەوستمەوە و گرەوی لەگەلّ دەکەم ،بەلّکو ***ئامادەی رووبەڕو بوونەوەشم*** جا هەر پلەیەکی بـەرزی کەنیـسەشی هـەبێت تـاوەکو دروسـتی و راسـتی شـوێنکەوتنی ئیسلامی بۆ بسەلمێنم ،من بەسۆزداری و لەخۆرا نەبوومەتە مـسولّمان،بەلّکو دوای لێکۆلینەوەیەکی قولّی ئاینەکان بوومەتە مسولّمان ، لە کۆتـایی لێکۆلینەوەکەمـدا بەوەگەیشتم کە ئیسلام ئاینێکی ئاسمانیە و ئاینێکـە خـودا کۆتـای پـێ بەهـەموو پەیامـە ئاسمانیـەکان هێنـاوە ، هـەروەها کـە پەیامبـەر(درود و سـەلامی خـودای لێبێت) دوایـنی نێردرا و پەیامبەرانە و عیساش(سەلامی خـودای لێبێـت) مرۆڤێکـە لە مرڤەکان و پەیامبەرەو زیاتر نا، خودای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:

مَّا ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ مَرۡيَمَ إِلَّا رَسُولٞ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهِ ٱلرُّسُلُ ﴿٧٥﴾ [٨٢] .

---

[82] - المائدة: ٧٥

من یەکەم کەس نیم لە قەشەکان کە مسوڵمان بووینە، ژمارەیەکی زۆر لە قەشە و مژگێنیدەرەکان لە مسوڵمان بوونیان پێشم کەوتوونە، لە سەروی هەموویانەوە ئەمینداری گشتی ئەنجومەنی کۆنگرەی مەترانەکان[٨٣] لە کەنیسەی کاسۆلیکی، و سەرۆکی قەشەکان لە ویلایەتی رۆژهەلات[٨٤].

**پرسیار: ئێستا تۆ بانگەوازکارێکی ئیسلامی، پێشتریش بانگەوازکارێکی نەسرانی بوویت... جیاوازی چیە؟**

پێشتر هەموو ئەوەی کە دەم ویست و پەیوەندی بەمنەوە هەبوو بەفەلەکردن( بەنەسرانیەتکردن) و دورخستنەوەی مسوڵمانان بوو لە ئاینەکەیان جا ئەگەر رەوشتیان تێك بچێت و بکەوتبوونایە گوناهە گەورەکانیش.. بانگەوازی کەنیسە بۆ پابەندبون (التزام) بە نەسرانیەت نیە، بەڵکو هەموو بایەخی لەوەدا کۆدەکاتەوە کە مرۆڤێك وشەی مەسیحی بلێت، مەرج نیە ئەم مۆرڤە دیندار بێت یان پابەندبێت بەئاینی مەسیحی[٨٥]. بەلام هەرچی ئیستایە پیاو لەئیسلامدا لێپرسینەوەی لەسەر هەموو گەورەو بچوکێك لەسەرە، هەموو کەسێکیش کە دەبێتە مسوڵمان دەبێت خاوەن بیروڕایەکی پاك و راست بێت.

**پرسیار: مسوڵمانەکان رەخنە لە کاری بە گاورکردن دەگرن لەکاتێکدا بۆخۆیان کاری بانگەواز بۆئاینی ئیسلام لەناو گەلانی نائیسلامی دەکەن... ئەم بانێك و دووهەوایە بۆچی؟**

---

[83] - مطران: رئیس الکهنة / مەتران. کرمانج_هەولێری.

[84] - مەبەستی سودانە..... کرمانج_هەولێری

[85] باشترین نموونەی زیندووش بۆ پشت راستکردنەوەی قسەکانی ناشوك ئەم گەنج ر لاوانەی لەمەر ولاتی خۆمانە کە بونەتە فەلە ، تەنها بۆ هەندێك دەستکەوتی ماددی . لەکاتیکدا ئەمانەی بەگاوریشیانکردوونە دەزانن هیچ پابەند بونێکی ئاینیەیان بە نەسرانیەتەوە نیە. کرمانج_هەولێری.

لێرەدا جیاوازیەکی زۆر لەنێوان بانگەواز بۆ ئیسلام و بانگەواز بۆ بەمەسیحی کردن(بەفەلەکردن) هەیە، بانگەوازکارە مسوڵمانەکان سەرەتا و زانیاری و وێنەی راستی ئیسلام نیشاندەدەن ،کەسێکیش ناچارناکەن بەوەی کەبچێتە ناوی ، چونکە ئەگەر مرۆڤ رەزامەند بوون و بیروباوەڕەوە خودانەپەرستێت بێگومان مسوڵمان بوونەکەی هیچ بایەخێکی نیە،بەڵام بانگەوازکاری نەسرانیەت بەداخەوە پێداویستی هەژار ونەدارەکان بەهەڵدەقۆزنەوە بەرامبەر بە گاوربوونیان، خۆراك و دەرمان و بواری کارکردنیان بۆ درەخسێنن ، ***هیچ یەکێك لەوانەی کە دەبن بەنەسرانی*** بروایان بە نەسرانیەت نیە چونکە هیچ زانیاریەکی ئاینی نیە کە ملی بۆبدەن و پێی بسازێن.دادوەرانە دەبێت ئەوەبلێین کە زۆرێك لەو رێکخراوە ئیسلامیانەی کە لە بواری مۆریی کاردەکەن پرۆژەکانیان مسوڵمان و نامسوڵمان سودی لێدەبینی و ئاین ناکاتە سنوور بۆ کارەکانیان، هیچ هەلقۆستنەوەیەکی وەك خۆراك بەرامبەر بە مسوڵمان بونیان نیە.

پرسیار: ئیستاکە رۆڵتان لە بانگەوازی ئیسلامیدا چیە؟

بەهۆی چالاکیەکانمانەوە لە (رێکخراوی دەستەبەری ئیسلامی بۆ گەشەسەندن و ئاوەدان کردنەوە)[٨٦] چاودێری دەیان هەزار لەو کەسانەدەکەین کە دەبنە مسوڵمان ، لەنێوان ئەوانەش رۆشنبیرو ئەفسەر و بەرپرس هەن لە هەموو کەرتە جیاوازەکان هەن کە ئێمە قوتابخانە و شوێنی قورئانی بۆ داموزراندون ، لێرەدا زیاتر لە ١٢ هەزار مسوڵمانی تازەهەن لە پیاو و ئافرەتان سەربە شوێنەکانی لەبەکردنی قورئانی پیرۆزن. بایەخیش بە سەرۆك هۆز و دەسەلات دارەکان دەدەین ،ئەمانە لەلایەن شوێنکەوتەکانیانەوە پلەو رێزیان هەیەو ئەگەر مسوڵمان

---

[86] - منظمة التضامن الاسلامي للتنمية و الاعمار.

بېن ئەوانیش مسوڵمان دەبن. تێبینیشمان کردووە کە زۆرێك لەو خێزانانەی باکور کاتی داگیرکاری سودان لەلایەن ئینگلیز ببونە نەسرانی و فەلە ئیستا لە خێزانە مسوڵمانەکان نزیك دەبنەوە ،ئێمەش کاردەکەین بۆئەوەی بیانگەڕێنینەوە سەر بنچینەی ئاینەکەیان.

# درێژەی نەخشەی کەنیسە بۆ بە گاورکردنی مسوڵمانان لە جیهاندا

دیمانە: ئەیمەن ئیبراهیم

وەرگێڕان: باوکی موحەممەد

گۆڤاری: "ئەل - موجتەمەع"

ژمارە: 1629

**پرسیار: دەوری ئەو ڕێکخراوە خێرخوازیە ڕۆژئاواییانە چیە لە جیهانی ئیسلامی بە گشتی و ئەفریقا بە تایبەتی ؟**

ـ لە ڕاستیدا ئەوانە ڕێکخراوی کەنەسەین و لە ژێر پەردەی ڕێکخراوە مرۆییەکاندا کار ئەکەن، بەلام ناوەڕۆکی کارەکەیان بە گاور کردنی مسوڵمانان و دورخستنەوەیانە لە دینەکەیان بە چەندەها ڕێگەو شێوازی جیاواز .

**پرسیار: ژمارەی ئەو ڕێکخراوانە چەندن کە کۆڕی کەنیسەی جیهانی بەڕێوەیان دەبات و چاودێریان دەکات ؟**

ـ سەر ژمێری کردن و ژماردنیان ئاسان نیە، بەلام ئەتوانم بڵێم کە ژمارەیان لە چەندەها هەزار تێپەڕ ئەکات، تەنها لە سوداندا ٥٠٠ ڕێکخراوی کەنیسەیی هەن کار بۆ کەنیسە ئەکەن .

**پرسیار: ڕێکخراوەکەنیسەی یەکان چۆن هەڵئەسن بە کاری بە گـاورکردنی مسوڵمانان ؟**

ـ ڕێکخراوە کەنەسیەکان، یان ڕاستر بڵێن نەسـرانیەکان، لـە خـۆوەو کوێرانـە هەڵناسن بەو کارە، بەڵکو بـە پێـی نەخـشەیەکی بـۆ داڕێـژراوو وورد کـار ئەکـەن، لێکۆڵینەوەی ئەو وولاتە یان ئەو شوێنە ئەکەن کە ئەیانەوی کاری تیـا بکـەن، بـە پێی نەخشەی ئەو ئایینانەی کە تیایەتی و شوێن کەوتەی هەر ئاینێك، پەیوەست بوونی خەڵکەکەی بە ئاینەکەیانەوە، پێویستی ئەو خەڵکـە بـە خزمەتگوزاریـەکان وەك پــارەو خــواردن و تەندروســتی خوێنــدن و خزمەتگوزاریــەکانی تــر، وە هۆکارەکـانی بـە گـاورکردنیش زۆرن، بـە پێـی ئـاینی ئـەو کەسـەی کـە ئەیانـەوی بیکەن بە گاور و ئەندازەی وابەستە بونی بـە ئاینەکەیـەوە ئـەگۆڕێت، ئـەو کەسـە چەندە پێویستی بە پـارە و مـاڵ و یارمـەتی و چارەسـەرکردنی بـاری گـوزەران و تەندروستی هەیە، بە نموونە : بێ دینەکان هیچ گرفتێکیان نیە لەوەی کە بـبن بـە گاور ئەگەر پێویستیەکانیان بۆ ئەنجام بدەن، بەڵام مسوڵمانەکان ئەوە ڕێکخـراوە کەنەسـیەکان لـە دوو ڕووەوە کـار ئەکـەن : یـان کردنیـان بـە گـاوور، یـان دورخـستنەوەیان لـە ئاینەکـەیان ئەگـەر نـەبوون بـە گـاوەر، وە هۆکارەکـانی بـە گاورکردنی مسوڵمانان پلە پلەو قۆناغ قۆناغ ئەڕۆن لە گەڵیدا هەڵیئەنێن و ئیغـرای ئەکەن بە زۆر شت .

**پرسیار: ئێوە چۆن کەسێکی مسوڵمانتان لە ئاینەکەی دوور ئەخستەوە ؟**

ــ ئەگـەر پابەنـد بوایـە بـە دینـەوە ئـەوە لـە ڕێگـەی ئیغـرا کـردن و هـەواو ئارەزوەکانەوە—شەهەوات— ئەچینە ژوورەوە، وەك پێدانی شوهرەت و ناوبانگ و دەستەبەرکردنی خوێنـدن یـان پلەوپایـە یـان ئـافرەت، یـەکێك لـە شـارەزاکانمان

بەردەوام هاوەڕێیەتی دەکات، هەموو پێویستیەکانی بۆ جێ بە جێ دەکات و بەردەوام لە گەڵیدا دەبێت بۆ شیکردنەوە و چارەسەرکردنی گشت گرفتەکانی تا وای لێ دێت دەبێتە کۆیلەی دەستی ئێمە و لە هەموو کارێکیدا دەگەڕێتەوە بۆ لامان، ئیتر وردە وردە لە گەڵیدا خەریك دەبین تاکو زۆر بە ئاسانی یان دەبێتە گاور و دێتە ناو ئاینەکەوە، یان لە ئاینەکەی خۆی دوور ئەکەوێتە و باوەڕی پێی نامێنێ .

**پرسیار: ئەی ئەگەر لە هەندێ وولاتدا سەرنەکەوتنایە لە مەبەستەکانی خۆتانداو فەشەلتان بێنایە چیتان ئەکرد ؟**

ـ ئەگەر ئەوە سەری نەگرتایە و سەرکەوتوو نەبوینایە، ئەوە چەندەها هۆکاری ترمان ئەگرتە بەر وەك زەخت کردنە سەر ئەو حکومەتانەی کە بە تەوجیهاتی کەنیسە نەئەڕۆشتن بەوە کە لە ڕێی چەند ولاتێکی ڕۆژئاواییەوە ئەو حکومەتە ئاگادار ئەکرایەوە، وە تەهدیدیمان ئەکرد بە بڕینی ئەو یارمەتی و خزمەتگوزاریانەی کە ئەماندا بە گەلەکانیان .. ئەو خزمەتگوزاریانەی کە نەیان ئەتوانی وازیان لێ بێنن و زۆریان پێویست پێی بوو، یان ڕێگەیەکی ترمان ئەگرتە بەر ئەویش دانانی جۆرێك لە گەمارۆی ئابوری لە سەریان یان دروستکردن و نانەوەی ئاژاوەی تایەفەگەری و ئاینی لە ناویاندا .

**پرسیار: دەربارەی سەرچاوەی ئەو پارانەی کە کەنیسە دەستی ئەکەوێت و ئەیبەخشێت چی هەیە ؟**

ـ لە ڕۆژئاوادا بە پێی ئەو یاسایەی کە هەیە ڕێژەی ٪٥ هەموو ئەوانەی کە لە وێ کار ئەکەن ئەڕوات بۆ کەنیسەو ڕێکخراوە کەنەسیەکان، ئەمە جگە لەوەی کە

زۆربەی ئەو دامەزراوە رۆژئاواییەنەی ئەفریقاو ئاسیا کەنیسەین بە پلەی یەکەم، بە مانای ئەوەی کە پارەکانیان بۆ بەرژەوەندی کەنیسە و چالاکیەکانی کەنیسە ئەڕوات و کەنیسەش لە لای خۆیەوە بۆ چالاکی و کارەکانی خۆی بەکاری دێنێ، بە نموونە : کەنیسەی میسۆری زیاتر لە ١٠ هەزار قوتابی لە خواروی سۆدان لە خۆی گرتووە و یارمەتیان ئەدات، تا لە داهاتوودا ببنە قەشە یان شارەزا لە ئاینی نەسرانیدا .

**پرسیار: زانراوە کە تۆ زۆرێك لە پلەو پایەی کەنیسەیی بەرزت هەبوو، هەستت بە چ جۆرە ژیانێك کردووە لە ناویانداو چۆن ژیاویت ؟**

ـ رێکخراوە رۆژئاواییەکان بێ لێپرسینەوە پارەیان بۆ ئەرشتن و هەموو پێویستیەکیان بۆ دابین ئەکردن لە کۆتایین مۆدیلی سە،یارەو خانووی چاك و هەرچی پێوستیەکەی ژیان بوو لە بەر دەستمانا بوو، سەفەرکردنمان بە سەرانسەری دنیا ئازاد بوو پارەکەی دەدرا، لە خۆشی و ژیانێکی بێ وێنەدا بووین، بەڵام لە گەڵ ئەوانەشدا بەردەوام هەستم بە بێ زاری و دڵڕاوکێی ئەکرد، هەستم ئەکرد کە ئەم کارانەی من ئەیکەم لە گەڵ سروشت و فیترەی مندا ناگونجێن، قەت هەستم بە هێمنی و ئارامی دەروونی نەئەکرد .

**پرسیار: چۆن ئەم ژیانە خۆش و ڕابواردنەت وازلێ هێنا و بەرەو ئیسلام هاتی ؟ چۆن قەناعەتت بە ئیسلام کرد ؟**

ـ سوپاس بۆ خوا ڕێگەی ڕاستم دۆزیەوەو هەموو خۆشی و شتەکانم بە جێ هێشت بۆ کەنیسە، بە ڕاستی هەستم کرد تازە لە دایك بووم، دوای ئەوەی لە ساڵی ٢٠٠٢ بومە مسوڵمان وئیسلامم قبوڵ کرد ئیتر تەواو دەرونم کەوتە ئارامی و

خۆشیەوە لە گەڵ ئەوەشدا کە بە چاو حاڵی پێشومدا ژیانێکی ئێجگار نەبوونی و دەست کورت ئەژیم، شارەزای ئیسلام بووم لە ڕێگەی بەراوردکردنی ئاینەکانەوە لە کاتێکا کە دیراسەی ماجستێرم ئەخوێند بەم دەرەنجامانە هاتمە دەرەوە :

- قورئان ناوی نوسەری هەڵنەگرتووە وەك لە ئنجیلەکاندایە و هەر یەکە بە ناوێکەوەیە .
- قورئان فەرموودەی خوای گەورەیە، باس لە ژیانی پێغەمبەران ئەکات هەر لە گەورەمان ئادەمەوە تاکو ﷺ .
- سیرەو ژیانی پێغەمبەر دوپاتی دەکاتەوە کە ئیسلام یەکەم ئاین و دواترین ئاینیشە.
- هەموو پێغەمبەران بانگەشەی تەوحیدو یەکتاپەرستیان کردووە، ئەمەش تەنها لە ئیسلامدا بەو شێوەیە ڕوون کراوەتەوە .
- هەموو پێغەمبەرێك گرنگیەکی تایبەتی هەبووەو بۆ گەلێکی تایبەت نێرراوە، بەڵام پێغەمبەری ئیسلام بۆ هەموو مرۆڤایەتیە بە گشتی ڕەوانەکراوە.
- کتێبە پێشووەکانی تر ناتوانن جیاوازی بکەینە نێوان گوفتاری خواو گوفتاری پێغەمبەرەکەو گوفتاری نوسەرەکە، هەرچی ئەوە ئەمانخوێندەوە : یوحەننا ووتی ، بەترەس ووتی .. هەروەها بەڵام لە ئیسلامدا فەرموودەی خوا ڕوونە کە قورئانی پیرۆزە، وە قسەی پێغەمبەریش ئاشکرایەو زانراوە ، ژیانیشی هەمووی نوسراوەتەوەو وون نەبووە، زانایانی ئیسلامیش قسەکانیان روونە (هیچ کام لە فەرمودی خواو پێغەمبەر و قسەی زانایان تێکەڵ بە یەکتری نابن)ئەمانە بەڵگەن لە سەر پاراستنی خوا بۆ ئەم دینە .

- ئیسلام دادپەروەری و یەکسانی تیایە بۆ هەموو مسوڵمانەکان بە بێ جیاوازی، بەڵام لە مەسیحیەتا یەکسانی نیە، من زۆر شت هەبوو جێگەی شەرمم بوو بە هۆی ڕەنگی پێستم، چونکە من شەرمم بە خۆم ئەهاتەوە لە بەر ڕەشپێستیم لە بەرامبەر سپی پێستەکانا، سەرەڕای ئەوەی کە مرۆڤ لە مەسیحیەتدا چەند جۆرو پلەیەکن، ڕەشەکان بۆ خۆیان نوێژ ئەکەن، سپی پێستەکانیش بۆ خۆیان، لە کەنیسەکانی ئەمریکادا ڕەش پێستەکان ناتوانن لە کەنیسەی سپی پێستەکاندا نوێژ بکەن، وەزیری دەرەوەی ئەمریکا ( کولن پاول ) ناتوانێت بچێتە کەنیسەیەکی سپی پێستەکان و قسەیان بۆ بکات، بەڵام لە ئیسلامدا ئەم جیاکاریە نیە، هەر کەس زوتر گەیشتە مزگەوت ئەوە ڕیزی پێشەوەی بەر ئەکەوێت، مرۆڤەکان لای خوا یەکسانن، زۆر ئاساییە ئەگەر ئیمامەکە سپی پێست بێت یان ڕەش پێست بێت و هیچ گرفتێك نیە، بەڕێزترین کەس لای خوا ئەوەیە تەقواو خواناسی زیاتر بێت بێ گوێدانە زمان و ڕەگەزو وڵات.

<u>پرسیار: چۆن کەنیسە هەواڵی ئیسلامەتی تۆیان پێ گەشت ؟</u>

ــ زۆر بێ زاربوون و توشی هەڵچوونێکی زۆر بوون، بە هەموو شێوەیەك هەوڵیان دا کە پەشیمانم کەنەوە لە ئیسلام، سەرەتا بە هەڵنان و ئیغرا کردن، هەموو شتێکیان خستە پێشم تاکو پاشگەز ببمەوە، وەعدو پەیمانی زۆر شتیان پێ دام، کۆمەڵێ شاندی زۆر لە ناوەوەو دەرەوەی سۆدان هاتن بۆ لام و پاڵەپەستۆیەکی ئێجگار زۆریان کردە سەرم، بەڵام کە زانیان بێ سوودە و من بە تەواوی لە ئیسلام تێ گەشتووم، ئیتر کەوتنە هەڕەشە لێکردنم بە کوشتن، تەنانەت هەڕەشەکە لە قسەو گوفتار تێی پەڕاندو ویستیان بە کردەوە جێ بە جێی بکەن، تا ئێستە چەند جارێك هەوڵی کوشتنیان داووم، ئێستە من ناوێرم

سەفەر بکەم بۆ وڵاتە رۆژئاواییەکان لە ترسی ئەوەی نەوەك بمکوژن، هۆزەکەم بەردەوام بەرگریم لیٚ ئەکەن، لەو کاتەوە هاتومەتە ناو ئیسلام هەست ئەکەم لە پارێزگاری پەروەردگاردام، دڵنیایی تەواووم بۆ دروست بووە کە مردن و ژیان بە دەستی خوایە، لە بەر ئەوە لە مردن ناترسم ، ئەوەی لە پێناوی بەرگری لە ئیسلامەکەیدا بکوژریٚ ئەوە شەهیدە، پاداشتێك گەورەو نەبڕاوەی لای خوای گەورە هەیە، بەڵام گاور و جووەکان زۆر سوورن لە سەر ژیان و ژیانیان زۆر خۆش دەوێت، بەڵام مرۆڤی مسوڵمان ئاینەکەی لە ژیانی خۆی خۆشتر دەوێت و هەرچیەکی بە سەر بێت لە پێناویدا پێی ڕازیە.

**پرسیار: دوای ئەوە کە مسوڵمان بوویت ..چ نەخشەیەکت بۆ داهاتوو کێشا ؟**

- هەندیٚ کتێبم نوسی لەوانە ( بۆچی مسوڵمان بووم ؟) وە کتێبێکیش لە سەر نەرم و نیانی و سەمەحاتی ئیسلام، دانەیەکی تریش لە سەر شتە داهێنراوەکانی مەسیحیەتی نویٚ، وە ژیانی خۆمم تەرخان کرد بۆ بانگ کردنی نامسوڵمانەکان بۆ ئیسلام، وە بەشداری کردنی کردەوەیی و بە بەرهەم لە بنیاد نان و نویٚ کردنەوەی سۆداندا لە ڕێگەی ڕێکخراوی ( یەکگرتنی ئیسلامی بۆ گەشە پێدان و ئاوەدانکردنەوەی سۆدان ) کە خۆم سەرپەرشتی ئەکەم .

**پرسیار: کتێبی ( بۆ مسوڵمان بووم ) گرنگترین ڕووەکانی چین ؟**

- بەراوردێکم کردووە لە نێوان ئیسلام و ئاینەکانی تردا، دژایەتی نێوان ئەو ئاینانەی ترم ڕوون کردۆتەوەو دەرم خستووە لە بەرامبەر جێگیر بوونی ئیسلام،

بە ڕاستی ئەوەی کە زۆر سەرنجی ڕاکێشام و پێی سەرسام بووم بەرنامەی میراتە لە ئیسلامدا کە بە چی شێوەیەکی ڕێك و دروست دانراوە، لە ئاینی جوولەکەدا یاسای میرات هەیە، بەڵام نارێك و پێکەوە ناتەواوی زۆر تیایەو دادپەروەرانە نیە، وە لە مەسیحیەتا یاسای میرات هەر نیە، بەڵام ئیسلام بە شێوەیەکی زۆرووردو ڕێك و پێك چارەسەری کردووە، تەنانەت هۆزی _ الدینکا_ کە من ئەگەڕێمەوە بۆی و مەسیحین، چەندەها ساڵ کێشەی بەشکردنی میرات هەبوو لە نێوانیاندا، بەڵام بە هۆی جێ بە جێکردنی یاسای میرات لە ئیسلامدا بووە هۆی چارەسەرکردنی کێشەکانیان و ناکۆکی نێوانیان کۆتایی هات .

**پرسیار: ژمارەی ئەوانە کە دوای مسوڵمان بونت شوێنت کەوتوون چەندن ؟**

- بە فەزڵ و ڕێزی خوای گەورە تاکو ئیستە ژمارەی ئەوانەی کە لە سەر دەستم مسوڵمان بوون گەشتۆتە ١٥٠ هەزار کەس، هەروەها ٢٥٠٠ لە گەورە قەشەو ڕێبەرانی نەسرانی، کە هەموویان لە خواروی سۆدان و شاخەکانی نۆبەو ناوچەی "ئەنجسنان".

**پرسیار: چۆن قەناعەتت بەو ژمارە زۆرە کردووە کە بێنە ناو ئیسلامەوە ؟**

- زۆر ئاسانە کە وا بکەیت ناسوڵمانەکان قەناعەت بە ئیسلام بێنن، چونکە هیچ شتێکی وایان پێ نیە، دوای ئەوە بۆم ڕوون کردونەتەوە کە ئیسلام ئاینێکە هیچ گومانێکی تیا نیە، ئاینێکە خوا تایبەتیەکی پێ داوەو هەر ئەو دینە لای خوای گەورە قبوڵەو وەرئەگیرێت :

﴿إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُ ﴾ [87]

[87] ال عمران:١٩

وە دواندن و خیتابی بۆ هەموو مرۆڤایەتیە بە گشتی، ئاینێکە کە چارەسەری هەموو گرفتەکانی ژیان ئەکات، هەروەها هەڵساوم بە نوسینی چەندەها نامە بۆ ئەو کەسانەی باوەڕیان بە مەسیح هەیەو ئەم شتانەم بۆ نوسیون :

خوا تەنهایەو هیچ هاوەڵێکی نیە، وە خوا سێ بەش نیەو بەڵکو تاك و تەنهایە

عیسا علیه السلام مرۆڤێکەو پێغەمبەرێکە، خوا ناردویەتی بۆ گەلەکەی، نە خوایە و نەکوڕی خواشە .

عیسا پێغەمبەری خوایە بۆ نەوەی ئیسرائیل بە تەنها، وە پێغەمبەرێك نیە بۆ گشتی مرۆڤایەتی و ئاینی نەسرانی تەنها بۆ نەوەی ئیسرائیل بوو، وە کوڕی خوای نیەو هاتبێتە خوارێ بۆ ئەوەی هەڵبواسرێ و ببێتە قوربانی لە پێناوی تاوانەکانی مرۆڤ و گەڕابێتەوە بۆ لای خواو لە لای ڕاستی باوکیەوە دانیشتبێ ! !، بەڵکو بەندەو پێغەمبەری خوایە.

<u>پرسیار :ئەی باشە حاڵ و وەزعی ناهەمواری مسوڵمانان بێ زاری نەکردیت و وای لێ نەکردی کە نەیێیتە ناو ئیسلامەوە ؟</u>

- بە ڕاستی واقم وڕما کاتێك کە مسوڵمان بووم بینیم کە مسوڵمانان ئیسلام لە ناو خویاندا جێ بە جێ ناکەن، بە ڕاستی خوای گەورە دوو سەرچاوەی ڕاست و دروستی بۆ ژیانی مەدەنی و سیاسی داناوە کە ئەوانیش قورئان و سوننەتن، بەڵام بە داخەوە مسوڵمانەکان لە ژیانی خۆیاندا جێ بە جێی ناکەن و فەرمانڕەی پێ ناکەن ،وە حکومەتەکانیش لە وڵاتە ئیسلامیەکاندا پابەند نین بە یاسای ئیسلام، لە بەر ئەوە لاوازی مسوڵمانان لە ئەنجامی دورکەوتنەوەیان لە ئاینەکەیانەوە دروست بووە، وە ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ دینەکەیان ئەوا بە هێز دەبنەوەو سەرکەتوو دەبن .

**پرسیار: حەز ئەکەین کە باسی هەندێ لەو چالاکیانەمان بۆ بکەیت کە بەشداریت تیا کردوون دژی ئیسلام.**

ـ لە ساڵی ١٩٨١ کۆنگرەیەکی نهێنی لە بنکەی لێکولینەوەی ستراتیجی لە ویلایەتی "تەکساس" گیرا، من یەکێك بووم لە ئەندامە کاراکانی ئەو کۆنگرەیە، دروشمەکەی بریتی بوو لە : "چۆن بەرەنگاری شەپۆلی ئیسلامی ببینەوە؟" لەوێدا وڵاتە ئیسلامیەکانمان جیاکردەوەو پۆلێنمان کردن بۆ ئەو وڵاتانەی کە زیاتری کاریگەری ئیسلامیان تیایەو پێشکەوتوترن وەك میسرو عیراق و پاکستان، وە وڵاتانێکیش کە زیاتر خۆشەویستی ئیسلامیان هەبێت وەك ئێران و ئەفغانستان و تاجکستان و شیشان و سودان و تشادو تورکیا .

کۆنگرەکە هەر وڵاتەی بە تەنیا خستە ژێر دیراسەو لێکۆڵینەوەی تایبەتەوە، لێکۆڵینەوەکەش بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارێکی گرنگ بوو ئەویش : چۆن بچینە ناو ئەو وڵاتانەوەو کار بکەین بۆ بە گاور کردنیان ؟ وە ئەگەر لەو مەبەستەمان سەرکەوتو نەبوین و توشی نسکۆ هاتین، ئەوا کەنیسە هەڵئەسێت بە نانەوەی ئاژاوەی ناوخۆیی، ئەمەش بە کردار کەنیسە بە یارمەتی وڵاتانی رۆژئاوا پێی هەڵساو سەرکەوتوبوون لەو خاڵەداو توانیان کە فیتنەو ئاژاوەی ناوخۆیی لە ئەفغانستاندا دروست بکەن و یارمەتی هەموو کۆمەڵە شەرکەرەکانیان ئەدا تاکو دژایەتی یەکتری بکەن .

هەروەها لە ئێراندا هەوڵیاندا بۆ ئەوەی کە سوننەو شیعە بکەن بە گژ یەکاو یەك نەگرن، وە ئەو تەمومژو ناکۆکی و تایەفەگەریەی کە لە ئێران و وڵاتانی کەنداودا هەیە ئەنجامی هەوڵ و تەقەلای ئەو رێکخراوە کەنەسیانەیە، وە کاتێك هاتنە سۆدان بینیان کە ئیسلام ئاینی بەرچاوو بڵاوە لە خواروی سودانا، سەیریان

کرد کە سۆدان دراوسێی کۆمەڵی وولاتی ئیسلامیەو کاریگەریان هەیە لە سەر خەڵکەکە، فەرمانڕەوای ئەو کاتەی ئینگلیز هەڵسا بە دانانی یاسایەك بە ناوی " ناوچە کەفالەت کراوەکان " کە بە پێی ئەو یاسایە قەدەغە بوو خەڵکی سەروو بچێتە بەشی خواروو، وە خەڵکی خوارووش بڕوات بۆ ناوچەکانی تر، ئەمەش بۆ ئەوەی بتوانن کە مەسیحیەت بە تەواوی لە خوارووداا بڵاو بکەنەوەو ئیسلامی تیا ریشە کێش بکەن، ئەم یاسایە کاری پێ ئەکرا تا سەردەمی سەربەخۆی ساڵی ١٩٥٦، وە ئەوەی ویستیان کردیان، ئێستاش کەنیسە بە هەموو هەوڵێکی ئەیەوێت کە لە دەسەلاتی ئیسلامی بدات لە سۆداندا، چونکە باوەڕی وایە کە بەرامبەر شەپۆلی تەنسیری وەستاوە .

**پرسیار: ئەی نەخشەی کەنیسە چی بوو بۆ ئەو وولاتانەی کە خستبونیە ژێر پۆلێنی پێشکەوتوتری ولاتەکان لەو کۆنگرەیەدا کە لە ساڵی ١٩٨١ بەسترابوو ؟**

ـ لەو ولاتانە عێراق و میسرو پاکستان، ڕۆژ ئاوا بە ئیعازی کەنیسە خستنیە ژێر وورد بینەوە تاکو بتوانێت حوکمیان بە سەردا بکات، ئەوەش لە ڕێگەی دروستکردنی گرفت و کێشەی ناوخۆیی لە لایەك وخولقانی ناکۆکی و شەڕو بێ متمانەیی لە گەڵ دراوسێکانیان لە لایەکی ترەوە، مەبەستەکەش وەستان و پەك کەوتنی پێشکەوتن و گەشە سەندنی زانستی و تەکنۆلۆجی ئەو وولاتانە بو ئەویش لە بەر خزمەتی قەوارەی زایۆنی، وە بە تایبەت عێراقەوە،سەرانی داگیرکەری کۆنی عێراق بەریتانیا هاتن بۆ لای سەددام و بە پێی ئەو نەخشە کۆنانەی کە هی سەردەمی داگیرکردنیانەوە لایان مابۆوە، توانیان سەددام قەناعەت پێ بکەن کە کوێت بەشێکە لە عێراق و پارێزگایەکی عێراقی بووە لە کۆندا، هەڵیان نا تا لە

سەر داگیرکردنی کویت سور بێت، ئـەمریکاش دەورێکـی زۆر گـەورەی هـەبوو لـە هەڵنانی سەددامدا بۆ داگیرکردنی کوێت، ئیتر دوای ئەوەی سەددام دەستی گلا لە داگیرکردنی کوێت و بەو شێوەیەی کرد کە ئەمریکا ویستی ، ئەمریکاش ڕێگەی بۆ خوش بوو تا دەست بکاتە جێ بە جێ کردنی چەندەها سیناریۆ کە ئێستە لە بەر چاومانەوە هەندێکیان دەبینین .

<u>پرسیار: چ دەورێکت پێ سپێراوە کە پێی هەڵسیت، وە ئـەو لایەنانـە چـی بوون کە کارت لەگەڵ ئەکردن ؟</u>

ـ ڕاسپێری کۆنگرەکە ئەوەبوو کە پێویستە عیلمانیەکان بە کار بێنین بۆ کـەم بونەوەو بەربەست کردین ئیسلامیەکان لە جیهانی ئیسلامیدا، ئـەویش لـە ڕێگـەی پاڵپشتیکردن و یارمەتی دانی کۆمەڵـە عیلمانیـەکان، وە پاڵـە پەسـتۆکردنە سـەر یەکێك لە وولاتە ئیسلامیەکان کە سەرانی بزوتنەو ئیسلامیەکان لـە گرتوخانـەکان تونـد بکـات، تەنانـەت ئەگـەر کـار بگاتـە ئـەوەش کـە سـەرانیان لـە نـاو بـەرن و تەسفیەیان بکەن .

جا لـەم بـوارەدا دەوری مـن کـورت کرابـۆوە لـەوەی لـە واسـیتە بم لـە نێـوان کەنیـسەی ڕۆژئـاواو ڕۆژهەڵاتـدا تـاکو بتـوانین یارمـەتی عیلمانیـەکان بـدەین دژی ئیسلام ، هەسـتام بـە گەیانـدنی بـڕی ملێۆنێـك و ٨٠٠ هـەزار دولار لـە کەنیـسەی هۆڵەندیەوە لە شـاری ئەمـستردام بـۆ کەنیـسەی میـسری تـاکو بـە سـەر سـەرانی عیلمانی میسردا بیبەخشن بۆ ئەوەی کە ئیسلامیەکان بگرن و ئەگەر پێویستیشی کرد تەسفیەی لاشەییان بکەن، بە تایبەت بەرامبەر کۆمەڵی " برایانی مسوڵمان " " الاخـوان المـسلمون " ئـەم پارەیـەش لـە نێـوان سـاڵەکانی ( ١٩٩٦ – ١٩٩٨ ) تەسلیمم کردووە، ئنجا یەك لە دوای یەك ڕاپۆرتـەکانمان پـێ ئەگەیـشت، وە ئـەو

کۆمەڵانەش کە ئەم کارانەیان ئەنجام ئەدا هیچ کامیان بەوی تریانیان نەئەزانی .

**پرسیار: کێ بوون ئەو کەس و لایانەنانەی کە لەو کۆنگرەیەدا بەشدار بوون ؟**

ـــ نوێنەرانی کەنیسەکانی وولاتە عەرەبی و ئیسلامیەکان، وولاتە ڕۆژئاواییەکان، تەوەرەی کاری کۆنگرەکەش بریتی بوو لەوەی کە چۆن کەنیسە بتوانێت زاڵ بێت بە سەر وولاتە عەرەبی و ئیسلامیەکانداو کاریان تیا بکات، یان لە ژێر پەردەی یارمەتی دانی مرۆیی، یان ئەگەر لەو ڕێگەوە بەروبومی نەبوو لە ڕێی پاڵەپەستۆکردنە سەر حکومەتەکان وەك باسم کرد .

**پرسیار: ئایا وا نابینیت کە ئەم قسانەی تۆ ئەیکەیت پڕ مەترسی بن بۆت و ژیانت بخەنە مەترسی مردنەوە ؟**

ـ بەڵێ هەست بەوە ئەکەم و ئازانم، بەڵام ویستم کە چەند نێهنیەکی کەنیسە کە لە دوتۆیی لاپەڕە شاراوەکانی خۆیاندایە دژی ئیسلام ئاشکرایان بکەم، بە تایبەت دوای ئەوەی کە بوومە مسوڵمان هیچ لە مردن ناترسم بە تایبەت ئەگەر بەرگری بێت لەم ئاینە پیرۆزە .

**پرسیار: کام وولاتی عەرەبی و ئیسلام ڕێکخراوو بانگەوازە بە گاورکردنەکانی تێدایە؟**

ـ زۆربەی وولاتە عەرەبی و ئیسلامیەکان شەپۆلی بەهێزی بە گاورکردن گرتویەتیەوە، بۆ هەر وولاتێك بەرنامەی تایبەتیان بۆی هەیە، ڕۆژئاوا ئەتوانێت چەندێك کەنیسەی بوێت لەو وولاتانەدا دروستی بکات، ئەویش لە ڕێی چەندەها شێوازو هۆکاری جیا جیا .

**پرسیار: لە چوارچێوەی ئەوەی کە ناو ئەبرێت بە ئیرهابی نێودەوڵەتی دیارە کەوا نەخشەیەك هەیە بۆ لێدانی کارە خێرخوازیە ئیسلامیەکان .. سیناریۆی ئەم نەخشەیە چۆن ئەبینیت ؟**

پەرەسەندن و زیادبونی کارە خێرخوازیە ئیسلامیەکان کەنیسەی بێزارو بێ تاقەت کردبوو، لە بەر ئەوە هەڵساوون بە ئەنجامدانی چەند بەرنامەیەك بۆ نەمانی کاری خێرخوازی ئیسلامی لەوانە :

- توجیهی وولاتە ئیسلامیەکان و ئاگادارکردنەوەیان بەنەهێشتن و بن بڕکردنی کارە خێرخوازیە ئیسلامیەکان .
- کار کردن بە هەموو شێوەیەك بۆ ڕاوەستان و پەك خستنی ڕێکخراوە خێرخوازە ئیسلامیەکان، تاکو گورەپانەکە چۆڵ ببێت بۆ ڕێکخراوە کەنەسیەکان و بتوانن بە ئارەزوی خۆیان هەرچی ئەیانەوێت بیکەن .
- پەرەپێدان و گەشە پێکردنی ڕێکخراوە ڕۆژئاواییەکان کە لە ژێر پەردەی ڕێکخراوە مرۆییەکاندا کار ئەکەن، تاکو هەڵسن بە کاری سیخوری و هەواڵنێری و کۆکردنەوەی زانیاری لە سەر ئەو وولاتانەی کە کاریان تیا ئەکەن .
- وە ئەگەر کەنیسە سەرنەکەوت لەوەداو فەشەلی هێنا، ئەوە هەندێ لە شوێن کەوتوو ئاڵقە لە گوێکانی خۆی بە کار دێنێ لە دروست کردن و هەڵگیرساندنی فیتنەو ئاژاوەی ئەهلی ناوخۆیی، تاکو ئاسایش و هێمنی تێك بچێت و ببێتە هۆی دەست تێوەردانی وولاتە ڕۆژ ئاواییەکان

**پرسیار: چ پەیامێکت هەیە کە پێت خۆش بێت بیگەیەنیت بەمسوڵمانان ؟**

- بۆ برا مسوڵمانەکانم ئەڵێم : خوای گەورە نیعمەت و بەختەوەری ڕشتووە بەسەرتانا بەم ئیسلامە دوور مەکەونەوە لێی و کەم و کوڕی تیا مەکەن، چونکە

بە راستی ڕۆژئاوای مەسیحی هەموو مەبەستێکی لە ناوبردن و پوکانەوەی ئیسلامە، ئەم ئیسلامەش گەورەترین دەسمایەو سەروەتی ئێمەیە، ئەگەر ئیسلامتان لە ژیانی خۆتاندا جێ بە جێ کرد ئەوە بە هێز ئەبن و ڕۆژئاوا لێتان ئەترسێت، تەنها ئەوەی کە لەسەرتانە ئەوەیە کە گرنگی بدەن بە زانست و زانیاری تا بتوانن بنەمایەکی پتەوو بە هێز دروست بکەن و بتوانن بە شێوەیەکی ماددی و مەعنەوی بەرەنگاری ئەو هەموو هێرشە ببنەو کە ڕوو بەرووی خۆتان و ئاینەکەتان ئەبێتەوە، وە بە بیروڕای من ئەگەر مسوڵمانەکان ٪١٠ لە ئاینەکەیان جێ بە جێ بکەن، ئەوە زاڵ ئەبن بە سەر ڕۆژئاوادا، وە زۆربەی گرفتەکانمان ئەبڕی، دەی چۆن ئەبێت ئەگەر هەموو ئیسلام جێ بە جێ بکەین !.

# پێرست